بسم الله الرحمن الرحيم

له رێساكانی

**عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت**

# لە ڕێسکانی عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت

ئامادەکردنی:

ماموٚستا کرێکار

# عەقیدەی
# ئەهلی سوننەت و جەماعەت

ئامـــــــــادەکردنی: مامۆستا کرێکار

بڵاوکردنـــــــەوەی: زادی ڕێمان

ســـــــــــاڵی: ٢٠١٨ز-١٤٣٩ھ

قەبـــــــــارە: ١٧*٢٤

له بڵاوكراوەكانی ماڵپەری زادی ڕێمان

زانكۆی ئازادی دیراساتی ئیسلامی زادی

بسم الله الرحمن الرحيم

إِنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أنْفُسِنا وَمِنْ سَيِّئاتِ أعْمَالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. أَشْهَدُ أنْ لَا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰه وَأَشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ وَرَسُولُهُ.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ

يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا * يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا

أمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كِتابُ اللهِ، وَخَيرَ الهَدِي هَدْيُ محمد صَلَى اللَهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ

وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ.

# ناوەڕۆك

ناوەڕۆك ........ ٦
پێشەکی ........ ٧
ڕێــڕەو ........ ٩
ڕێساو بنەماکانی ........ ١٢
مەنهەجی وەرگرتن و بەڵگەسازیی ........ ١٢
بریکاریی خوای گەورە لەسەر زەمین (ئیستیخلاف) ........ ١٧
ناسینی خوای گەورە ........ ٢٠
(تەوحیدی پەروەردگارێتی و ناوو سیفات) ........ ٢٠
مافی تەنهاپەرستنی خوای گەورە ........ ٢٥
(تەوحیدی خوایەتی: الألوهية) ........ ٢٥
بــاوەڕ ........ ٣٢
قورئان و ئاخاوتن ........ ٣٦
حەوتەم: ........ ٣٨
قەزاو قەدەر ........ ٣٨
ئوممەت (گەل) ........ ٤٠
ئەحکامی ئیمامەت ........ ٤٣
(دەسەڵات) ........ ٤٣
دارولئیسلام و دارولکوفر ........ ٤٨
(دەوڵەتی ئیسلامی و دەوڵەتانی کوفر) ........ ٤٨
گرنگترین تایبەتمەندییەکانی ........ ٥٠
ئەهلی سوننەت و جەماعەت ........ ٥٠
پوختەی دیدو ڕێی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ........ ٥٤

## پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على رسوله الأمين محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

ئەسڵی ئەم نامیلکەیە پوختەیەکی رێساکانی عەقیدەبوو لە دیدی ئەهلی سوننەت و جەماعەتەوە کە دکتۆر ناصر عەبدولکەریم ئەلعەقل نوسیبووی و پێش بڵاوکردنەوەی _وەکو لە پێشەکییەکەیدا نوسیویەتی_ نیشانی چەند زانایەکی شارەزای عەقیدەو ئەحکامی دابۆوە. برایەکی بەڕیزی خۆمان پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم کە بیکەینە کوردی و لە ناوەندی دیراساتی ئیسلامیی (ندا)دا بیکەینە بەرنامەی خوێندن. کە خوێندمەوە بینیم رێساکانی وەکو ماددەو بڕگەی دەستووریی کورت و پوخت و گشتگیر دارێژراوە، بەڵام حەیفێ هیچی وای لەسەر کێشە عەقائیدیی و فیکرییەکانی سەردەم نەنوسیوە، وەکو ئیستیخلاف و حاکمێتیی و سەروەرێتی شەرع و طاغووت و دارولئیسلام و دارولکوفرو کۆمەڵکاریی ئوممەتی و جیهادو هیتر. بۆیە لە سەرەتادا وویستم هەر ئەوەی ئەو بکەمە بەرنامەکە، بەڵام دواتر وام پێباشبوو ئەم باسانەی سەردەمیشیان بۆ ئیزافەبکەم، نەشدەکرا بە جیا وەکو پاشکۆ دایاننێم، چونکە لە تەوەرەباسەکانی خۆیان دووردەکەوتنەوە. بۆیە منیش راڤەی هەندێک لەو زاراوانەی سەردەمم کردو کردمنە رێسای تری عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، کە بێگومان منیش هەر

لە دەقەکانی قورئان و سوننەت و کۆڕا (ئیجماع)ی ئوممەتەکەمانەوە هێناومە. هەر یەکێک لەم زاراوانەی سەردەمیش گرنگیی و کاریگەریی خۆیی لە نەوەکانی نوێی ئوممەتدا هەیە. کێشەکانی حاکمێتی هیچیان کەمتر نییە لە کێشەی خەلقی قورئان کە لە زەمانی خەلیفە مەئموونڈا بوو بە کێشەی گەورەی نێوان ئوممەت و دەسەڵات. یان کێشەی کۆمەڵکاریی ئوممەتی بۆ هێنانەوەی سەروەرێتی شەرع لە وڵاتی موسوڵماناندا.

لەبەر ئەم شێوەکارەی لێرەدا گرتوومەتەبەر ناتوانم بڵێم ئەمە هەر نامیلکە پوختەکەی دکتۆر ناصرەو کردوومەتە کوردی. نا، ئەمەی بەردەست هەمووی ئەوەی ئەوەو بەقەدەر ئەویش ئیزافاتی منی تێدایە. بۆیە نەمتوانی ناوی بنێم وەرگێڕراوی نامیلکەکەی ئەو، نەشمتوانی ناوی بنێم دانراوی خۆم! چونکە لە راستییدا ئەوەی من کردوومە: ئامادەکردنە. منیش لە چەندین راو بۆچوونی زاناو بیرمەندی ترم وەرگرتووەو _بە دارِشتنەوەی نوێ_ ڕێکمخستوونەتەوە.

خوای گەورەش لێمانی وەرگرێت و بیکاتە مایەی بەرچاورِۆشنیی موسوڵمانان... ئامین

کرێکار / جومادای یەکەمی ١٤٣٩

کانوونی دووەمی ٢٠١٨

## ریـــڕەو

**عەقیدە**: لە رووی زمانەوانییەوە: ئەم مانایانە دەگەێنێت:

_ **العقد**: گرێ، گرێبەست.

_ **التوثیق**: متمانەپێکردن، ئیعتیمادکردنەسەر.

_ **الإحکام**: توندکردن و قایمکردن.

_ **الربط بقوة**: توندبەستن.

لە رووی زاراوەییەوە: ئەو باوەڕکردنە پتەوو دامەزراوەیە کە لای خاوەنەکەی هیچ جۆرە گومانێکی تێدا نەماوە کە راستە.. کەوابوو:

**عەقیدەی ئیسلامی** بریتییە لە: باوەڕهێنانێکی دامەزراوو پتەو بەخوای پەروەردگار (بەوەی کە دەبێ بە تاکوپاک بناسرێت و ملکەچیی بۆ فەرمانەکانی دەربڕڕێت) ، هەروەها باوەڕهێنانێکی دامەزراوا بە فریشتەکانی و بە پەیامەکانی و بە نێرراوەکانی و بە رۆژی دوایی و بە قەدەرو بە هەموو هەواڵ و باسێکیتری نادیار (غەیب) و بە هەموو بەڵگەنەویستەکانی دین: زانین و سەلماندنیان بێت یان کردن چەسپاندنیان.

**سەلەف:** پێشەوایانی ئەم ئوممەتەن، لە یاوەران و شوێنکەوتووانیان و پێشەوایانی رێنمایی خوایی کە لە سێ سەدە چاکترینەکەدا ژیاون. هەروەها هەر کەسێکیتر _لەسەردەمەکانی

دواتر_ کە لەسەر دیدو ڕێی ئەوان ڕۆیشتبێت و بڕوات _وەکو ئینتیمای بۆ ئەوان_ پێی دەوترێت: سەلەفی..

**ئەهلی سوننەت و جەماعەت:**

**ئەهل**: وشەیەکی عەرەبییە، مانا زمانەوانییەکەی واتە: کەسوکار (أهل الرجل)، خەڵکی شوێنێک (أهل أربِيل)، هەروەها ئەو کەسانەی کە پابەندی بە دیدوڕێ و ڕەفتارێکی دیاری کراوی بوارێکن، وەکو دەوترێت: (أهل الفن). لێرەشدا بەم مانایەی دوایی هاتووە.

**سوننەت**: وشەیەکی عەرەبییەو مانای زمانەوانییەکەی: ڕێگاو ڕێبازە. مانای زاراوەییشی بریتییە لە هەموو ئەو باوەڕو بۆچوون و زانست و کردارو ڕێنمایی و ڕەفتارەی کە پێغەمبەری خوای صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەسەربووە.

**جەماعەت**: وشەیەکی عەرەبییەو مانای زمانەوانییەکەی: کۆمەڵە. مانای زاراوەییشی: یاوەرانی پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، هەروەها ئەوانەی لەسەر ئەو دیدو ڕێبازەی ئەوانن.

کەوابوو **ئەهلی سوننەت و جەماعەت**: هەموو ئەو کەسانەن کە لەسەر دیدو ڕێبازی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و یاوەرانی دەڕۆن. کە ئەمە سیفەتە سەرەکییەکانیانە:

١. لەروانگەو پێناسەی عەقیدەتیی و زانست و كردەوەو دینداریی و رەفتارو رەوشتدا شوێنكەوتەی پێغەمبەری خوان صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و بە دیدوڕێ و سوننەتییەوە، پابەندن.

٢. لەسەر ئەو حەق و حەقخوازییە كۆبوونەتەوە، كە یاوەرانی لەسەربووە. ئەمانیش ئەسڵی دینەكەیان پاراستووەو تەفرەقەیان تێنەكەوتووە تێیدا. شوێن پێشەوایانێک كەوتوون كە ئەو حەقەیان ناسیووە كە لای یاوەران بووە، پێوەی پابەندبوون و رۆیشتوون لەسەریی و لێیان لانەداوە.

٣. لەبەر ئەوەی كە زۆر پابەندی سوننەتبوون و سووربوون لەسەر ئیقتیداكردن بە سییرەو سوننەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێشیان ووتراوە (**أهل الحديث**: فەرموودەوانان) و (**أهل الأثر**: ئاسەوارییان)و (**أهل الإتباع**: ئەهلی شوێنكەوتن)و (**الطائفة المنصورة**: دەستەی سەركەوتوو) و (**الفرقة الناجية**: كۆمەڵی سەرفراز).

٤. پابەندبوون بە مەنهەجەكەی یاوەران لە دیدو رێ و بزاوت و هەڵوێست و رەوشت و رەفتاردا گرنگەو داواكراوە، نەک خۆهەڵكیشان بە ناوەكەو پاڵانتەی ئینتیما بۆی وەكو زۆر كەس و لایەن دەیكەن.

**یەكەم:**

## ڕێساو بنەماكانی
## مەنهەجی وەرگرتن و بەڵگەسازیی

١. ئەو سەرچاوەی كە عەقیدەكەی لێوە وەردەگیرێت قورئان و سەحیحی سوننەت و كۆڕا (ئیجماع)ی پێشینەی چاكەكە (سەلەفی صالح) ی ئوممەتە.

٢. هەر رەفتارێک (گوفتارو كردورو بڕیار) سەلمێنرابێت كە لە پێغەمبەری خواوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هاتووە قبوولكردنی فەرزە، ئەگەرچی بە فەرموودەی ئاحادیش هاتبێت.

٣. سەرچاوەی تێگەیشتنی قورئان و سوننەت: ئەو دەقانەن كە روونیاندەكەنەوە. كە بە تێگەیشتنی سەلەف و ئەو زانایانە دەبێت كە لەسەر دیدوڕیی ئەوان بوون.

هەرچی شتێک ئاوا سەلمێنرابێت و چەسپێنرابێت بە مانایەكی ئەگەرییانەی زمانەوانی (إحتمالات لغوية) ئیلغاناكرێتەوە.

٤. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەر هەموو بنەماكانی ئیسلامی روونكردۆتەوە. بۆیە كەس بۆی نییە شتێكی تر داهێنێت و بڵی ئەمەش لە دینەكەدایە.

٥. موسوڵمان دەبێت لە رواڵەت و ناخدا تەسلیم بە فەرمانەکانی خواو پێغەمبەری خوا بێت صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆی نییە بە پێی بەرواووردو پێوان (قیاس) یان کەشف و زەوق یان بە قسەی ئەم شێخ و ئەو ئیمام بەرهەڵستی دەقێکی قورئان یان سەحیحی سوننەت بکات، چجای رەتیبکاتەوە.

٦. ئەقڵ ناخرێتە پێش نەقڵ. هزری راشکاوو دامەزراو لەگەڵ دەقی سەحیحی نەقڵکراودا یەکدەگرێتەوە، هیچیان _مادام بەڵگەی بنبڕین_ یەکتریی ئیلغاناکەنەوە. هەر کاتێک پێکەوە نەسازێنران کار بە دەقە نەقڵکراوەکە دەکرێت.

٧. پێویستە موسوڵمان بە زاراوە شەرعییەکانی عەقیدەکەوە پابەندبێت و زاراوە داهێنراوەکان کەنارخات. ئەو وشانەی گشتین و مانای راست و چەوتیان لێ دەفامرێتەوە، دەبێ بەدواداچوون و توێژینەوە بۆ راستی ماناکەی بکرێت، هەر مانایەکی بە رێگای شەرعییانەو بۆ واتای شەرعیی شیاوبوو وەردەگیرێت، هەر واتایەکیشی پێچەوانەی شەرع بوو وەلادەنرێت.

٨. بێگوناحیی (العصمة) بۆ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سەلمێنراوە و کۆی ئوممەتەکەشی بەردەوام لەسەر حەق دەمێنێتەوە. چونکە ئوممەتەکەی لەسەر گومڕایی کۆنابێتەوە. بەڵام تاک تاکیان وا نین. کەسیان بە تاکیی خۆی بێگوناح (مەعسووم)

نییە. یەکلاییکردنەوەی راجوێی نێوان پێشەوایان بە پێی قورئان و سوننەت دەبێت. هەرکامێکیان بەهەڵەداچووبوو بە موجتەهیدی خاوەن عوزر پاداشت دەناسرێت .

٩. ئیلهام و کەرامات لە پیاوچاکانێکی ئوممەتدا دەردەکەوێت. خەونی راستیش حەقەو بەشێکە لە پێغەمبەرێتی. فیراسەی راستیش حەقە.. مەرجە ئەمانە هەمووی _کە لەگەڵ شەرعدا یەکبگرنەوە_ رێزی خوایین و بە لوتفی خۆی دەیبەخشێت، بەڵام نابنە سەرچاوەی دیدی عەقائیدیی و ئەحکامی شەرع.

١٠. جەدەل و شەڕەقسە لە باسەکانی دیندا زەمکراوە، بەڵام موناقەشەی جوان و نەرمونیان مەدحکراوە. هەر باسێک بەرهەڵستی لەسەر هاتبێت _کە نەکەونە ناویەوە_ دەبێ خۆی لێ بەدوور بگیرێت، هەروەها لەهەموو ئەو باسانەدا کە موسوڵمان زانیاریی لەسەری نییە.. لە هەر باسێک کە دەربارەی سیفاتی خوای گەورەیەو موسوڵمان شەرحکردنەکەی نەزانی، پێویستە زانینی چۆنیەتییەکەی بۆ خوای گەورە بگێڕێتەوە.

١١. پێویستە وەڵامدانەوەی بەرامبەران لە موناقەشەکانی عەقیدەو ئەحکامدا بە پێی وەحی بێت. نەک وەڵامدانەوەی بیدعە بە بیدعە. وەڵامدانەوەی شلگیریی بە تونڕەوێتی ناکرێت. وەڵامی شلگیرانەش بەرامبەر توندڕەویی نابێت..

١٢. هەموو داهێنانێک لە بنەما دینییەکاندا بیدعەیە، هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە، چارەنووسی هەموو گومڕاییەکیش ئاگری دۆزەخە.

١٣. وەرگرتنی بۆچوونی پێشەوایانی بەڕیزی مەزهەبەکانی ئەهلی سوووننەت و مەزهەبەکانیان فەرز نین. هەر دیدو راو رەفتارێک بەڵگەی لە قورئان و سوننەت و کۆڕا هەبێت وەرگرتنی فەرزە، با پێچەوانەی مەزهەبەکانیش بێت. بۆچوونی هەموو پێشەوایانی دینەکە جێ ڕێزن، بەڵام کەس مولزیم ناکەن.

١٤. ئەهلی سوننەت و جەماعەت چینایەتیی تێدا نییە، نە چینایەتی ماڵ و سامان و نە چینایەتیی دینداریی. چینی تایبەت و چینی گشتییان نییە، چینێکیان نییە زانایانی حەقیقەت بن و چینێکیتر زانایانی شەریعەت و چینێکیتریش عەوام. دینەکە یەکە، لە یەک خوای پەروەردگارەوە هاتووە، یەک پێغەمبەر گەیاندوێتی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و هەموو شوینکەوتووانیشی لەبەرامبەرییدا یەکسانن.

١٥. دیدو ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت خودی ئیسلامەکەیە، بە پێناسەکەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ما أنا عليه وأصحابي). بۆیە سەر بە ئیمامێکی دیاریکراونییە (وەکو ئەشعەریی و ماتۆریدیی) یان ناوێکی تایبەتی نییە (وەکو موعتەزیلەو مورجیئەو قەدەریی).

١٦. ئەهلی سوننەت و جەماعەت خاوەن دیدوڕێی پێچەوانەی بەرامبەریان بە کافر دانانێن مادام نەکەوتبنە رەفتاری کوفرینەوە. لەم رێسایەوەیە کە ئیسماعیلی و نوصەیریی و قادیانیی و کۆمۆنیستی و هاوشێوەیان بە کافر دەزانن.

١٧. ئەهلی سوننەت و جەماعەت تەبەڕا لە کافرو موشریک و مورتەددو بێدین و هاوشێوەیان دەکەن، دژیان دەوەستنەوەو بە هیچ شێوازێکی دۆستایەتیی (وەلاء) لایەنگیرییان ناکەن. لەبەرامبەردا موسوڵمایان خۆشدەوێت و پشتیوانی لێدەکەن و لەسەر کاری خێرو چاکە یارمەتییدەری دەبن. لەو کەسە نزیکن کە لە ئیسلامەوە نزیکەو لەو کەسە دوورن کە لە ئیسلامەوە دوورە.

**دووەم:**

## بریکاریی خوای گەورە لەسەر زەمین (ئیستیخلاف)

١. مرۆڤ (وجود)ێکیتری پێش خەلقبوونە بەشەرێتییەکەی هەبوو. پێش ئەوەی خوای گەورە ئادەم علیه السلام خەلقبکات و بینێرێتە سەرزەمین. لەم قۆناغەدا (کە کات و شوێن و چۆنییەتییەکەی نازانین) خوای گەورە سێ ڕەفتاری وەل ڕۆحی مرۆڤدا نواند: شاهێدیدانی لەسەر خوایەتی خوای گەورە، نیشاندانی هەڵگرتنی بەرپرسێتی ڕاسپاردە (ئەمانەت)ە خواییەکەو تەعینکردنی بەبریکار لەسەرزەمین .

٢. سەرجەمی ئایەتەکان بریکارێتیی مرۆڤ ڕووندەکەنەوە بۆ خوای گەورە، کە بۆ ئەوە هێنراوەتە سەرزەمین تا دەسەڵاتی بەسەردابگرێت و دینی خوای گەورەی تێدا بچەسپێنێت.

٢. هەنگاوەکانی شیاوکردنی مرۆڤ بۆ بریکاریی بریتین لە:

أ ـ باوەڕهێنان بە پەروەردگارێتی خوای گەورە: (توحید الربوبیة): لە ڕێگای وەحی خواییەوە دەزانرێت.

ب ـ زانینی و بەجێهێنانی مافی خوای گەورە لە پەرستنییدا (توحید الالوهیة): لە ڕێگای ڕێنمایی پێغەمبەرانەوە سەلامی خوایان لێ بێت.

ج ـ زانین و تەسلیمبوون بە حاکمێتی خوای گەورە (توحید الحاكمية): کە بە سەروەرێتی شەرع دێتەدی، کە بەدەستەوەبوونی دەسەڵاتی باڵای وڵاتەو تەنها ئەو مافی دانانی دەستوورو داڕشتنی یاسای هەیە.

د ـ سەلماندن و چەسپاندنی دینداریتی راست و رەوا (ئەرکەکانی عبوودییەت) بە:

ـ پەروەردەی دەروون: کە پاڵفتەی ناخ (تەزکیەی نەفس)ە.

ـ پارسەنگی رەفتارو رەوشت: کە زانین و پابەندبوونە بە سنووری مافی خۆو مافی بەرامبەرانەوە.

هـ ـ راگەیاندنی بانگەوازی خوایی و گەیاندنی دینەکەی بە خەڵکی.

و ـ پێکەوەنانی ئوممەتێکی عەقائیدیی لە شوێنکەوتووانی وەحییە خواییەکە، بە برایەتی دینیی.

ز ـ کۆمەڵکاریی و بزاوتی ئوممەتیی بۆ بنیاتنانی دارولئیسلامێک کە بە سەلماندن و چەسپاندنی حاکمێتی شەرع و دابینکردنی ئاسایش و ئەمان دەبێت بۆ دانیشتوانەکەی.

ح ـ پیادەکردنی دادپەروەریی: بە دامەزراندنی ئیدارەی راشیدانەی دەوڵەت و ئاڕاستەی خواویستانەی کۆمەڵگە.

ط _ دەرهێنانی خێروا بێری سەرزەمین و سوودوەرگرتن لە رێساکانی وجود، بۆ دابینکردنی نان و ئەمان و بەختەوەریی مرۆڤایەتیی.

ی _ دابەشکردنی سامان و داهات و دەسکەوتی وڵات بەسەر دانیشتوانی دارولئیسلامەکەدا بە پێی سەریعەتی ئیسلام، کە ماف و ئەرک و دەسەڵاتی هەموو لایەنێکی دیاریکردووە.

**سێیەم:**

## ناسینی خوای گەورە
## (تەوحیدی پەروەردگارێتی و ناوو سیفات)

١. ئەسڵ لە ناوو سیفەتەکانی خوای گەورەدا ئەوەیە کە بە هەرچی سیفەتێک خوای گەورە خۆی پێ وەسفکردبێت، یان پێغەمبەرێکی خوا علیهم السلام وەسفی کردبێت پێی، دەبێ ـبە بێ چواندن و بە بێ چۆنیەتیی بۆدانان ـ وەسف بکرێتەوە پێی. هەروەها دەبێ بەدووربگیرێت لە هەموو سیفەتێک کە خۆی لێ بەدوور گرتووە یان پێغەمبەرێکی خوا علیهم السلام خوای گەورەی لێ بەدوور گرتووە. بێ لێلادان وپەکخستنی. هەر وەکو کە خوای گەورە دەفەرموێ: (لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ) الشورى/١١ واتە: هیچ شتێک وەکو خوای گەورە نییە، خوای گەورە بیسەرو بینەرە. لەگەڵ باوەڕهێنان بە واتای دەقەکان و ئەوەی لێیان دەفامرێتەوە.

٢. چواندن و پەکخستنی ناوو سیفاتی خوای گەورە کوفرە. ئەمما ئەو لێلادانەی بیدعەچییەکان پێیدەڵێن: (تەئویل) واتە لێکدانەوە، ئەوە جۆری وای هەیە کوفرە، وەکو تەئویلاتی باطنییەکان. جۆری تری هەیە بیدعەی گومڕاییبوونە، وەکو لێکدانەوەی ئەوانەی نکووڵی لە هەندێک لە سیفەتەکان دەکەن. جۆری تریشی هەیە کە لە بازنەی بەهەڵەداچووندایە.

٣. یەکبوونیی وجود(وحدة الوجود)و باوەڕبوون بەوەی کە خوای گەورە لە هەموو مەخلووقاتەکانیدایەو یەکیگرتووە لەگەڵیانداو ئاوێتەبوون، ئەمە کوفری زەقەو خاوەنەکەی لە دین و ئوممەت دەباتە دەرەوە.

٤. باوەڕبوون بە فریشتەی بەڕێز بە شێوەیەکی گشتی، لەگەڵ باوەڕهێنان بە تایبەتمەندییەکانیان کە بەڵگەی سەحیحیان لەسەرە، وەکو ناوو سیفاتیان، کارو ئەرکیان.. ئەمەش بە گوێرەی توانای فێربوونی موسوڵمانە موکەللەفەکە دەبێت.

٥. باوەڕبوون بە کتێبی هەموو پەیامە ئاسمانییەکان، کە قورئان چاکترینیانەو هەموو ئەوانی پێشخۆی نەسخکردوونەتەوە (لایبردوون). ئەوانەی پێش قورئان هەر هەموویان گۆڕانکاریی بەسەر دەق و مانایاندا هاتووە، بۆیە هەر دەبێت شوێن قورئان بکەوین و بەس.

٦. باوەڕبوون بە پێغەمبەران و نێرراوانی خوای گەورە علیهم السلام باوەڕبوون بەوەی کە ئەوان چاکترین مرۆڤن و هەر کەس باوەڕی وا نەبێت کافرە. باوەڕبوون بە هەموو ئەو ڕەفتارانەی کە بەڵگەی سەحیح دەربارەیان هەیە، فەرزە. باوەڕبوون بە موعجیزەکانیان بە شێوەیەکی گشتی فەرزە. هەروەها باوەڕبوون بەوەی کە محمد صَلَّی

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ کۆتایانەو چاکترینیانەو خوای گەورە بۆ هەموو مرۆڤایەتیی ناردووە، فەرزە.

٧. باوەڕبوون بەوەی کە لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وەحی بۆ کەسی تر نەهاتووەو نایات. هەر کەسێک دیدو رای پێچەوانەی ئەمە بێت، کافرە.

٨. باوەڕبوون بە هەبوونی رۆژی دوایی و حەتمێتی هاتنی، فەرزە. هەروەها باوەڕبوون بە هەموو ئەو هەواڵ و باسانەی دەربارەی _بە بەڵگەی سەحیح_ سەلمێنراوە، لە: مەرج و دەرکەوتنی نیشانەکانی پێش هاتنی رۆژی دوایی خۆی.

٩. باوەڕبوون بە قەزاوقەدەر، کە چاکەو خراپە هەر لە خوای گەورەوەیە. خوای گەورە پێش بوونی شت[١] دەیزانی دەبێت. ئەمەشی لە (لەوحولمەحفووز)دا نوسیوە. ئەوەی خوای گەورە وویستێتی بووە، ئەوی ئەو نەیوویستووە نەبووە. هەرچییەک ئەو نەیەوێت نابێت. ئەو توانای بەسەر هەموو شتەکاندا دەشکێت، خۆی هەموو شتەکانی دروستکردووەو هەرچییەکی بوێت دەتوانێت بیکات.

[١] پێش بوونی بزاوت و سرەوت و کات و شوێن و چۆنیەتیی حاڵەتی شتەکە.

١٠. باوەڕبوون بە هەموو ئەو نادیارانەی بەڵگەی شەرعییان لەسەر هەیە، وەکو: عەرش و کورسی و بەهەشت و دۆزەخ و خۆشی و ناخۆشی ناوگۆڕو پردی سیرات و تەرازووی چاکەوخراپەکێشان و ئەوانیترو ڕێشنەدرێت لێکدانەوەی بێ بەڵگەیان بۆ بکرێت.

١١. باوەڕببون بە شەفاعەت (تکاکاریی) پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و شەفاعەتی پێغەمبەرانی تر سەلامی خوایان لێ بێت. هەروەها شەفاعەتی فریشتەکان و پیاوچاکان و شەهیدان و هیتر لە ڕۆژی دواییدا ، بەو تەفسیلاتەی کە لە بەڵگە سەحیحەکاندا هاتوون.

١٢. باوەڕبوون بەوەی کە موسوڵمانان لە کات و شوێنی حەشرو لە بەهەشتدا خوای پەروەردگاری خۆیان دەبینن. ئەمە حەقەو هەرکەسێک نکووڵی لێبکات، یان لێکدانەوەی تری بۆبکات، گومڕایە.. ئەم بینینە لە دنیادا بۆ هیچ کەسێک نەبووەو نییە.

١٣. باوەڕبوون بە کەراماتی ئەولیاو پیاوچاکان، کە حەقە. بەڵام هەموو روداوو رەفتارێکی نائاسایی کەرامات نییە. دەشێت (ئیستیدراج) بێت. یان دەشێت لە کاریگەریی شەیتانەکان و جادووگەرانەوە بێت. پێوەری بە رەوا یان بە ناڕەوا زانینی ئەم رەفتارانە قورئان و سوننەتە.

١٤. موسوڵمانان هەموویان ئەولیای خوای گەورەن، هەموو موسوڵمانێک بە قەدەر راداو بڕی ئیمان و تەقواکەی (وەلییەت)ی تێدایە.

**چوارەم:**

## مافی تەنهاپەرستنی خوای گەورە (تەوحیدی خوایەتی: الألوهية)

١. خوای گەورە یەکەو تاک و تەنهایە، هیچ هاوبەشێکی نە لە پەروەردگارێتییەکەیدا هەیەو نە لە خوایەتییەکەیداو نە لە ناوو سیفەتەکانیدا، ئەو خوای پەروەردگاری جیهانیانەو تەنها ئەو شایانی هەموو جۆرە پەرستنەکانە بۆی بکرێت.

٢. نابێت و ناشێت _بە هیچ رادو برێک_ هیچ جۆرە پەرستنێک بۆ غەیری خوای تاکوپاک بکرێت. وەکو: لێپاڕانەوەو هانابۆبردن و داوای یارمەتیلێکردن و نەزربۆلەخۆگرتن و نەزرکردن و قوربانیبۆکردن.. یان پشتبەستن و لێترسان و ئومێدپێوەبەستن و خۆشوویستن و هیتر. هەر شتێک لەمانە _بە هەر رادوەبرو شێوازو چۆنیەتییەک_ بۆ غەیری خوای گەورە بکرێت، شیرکە، بە هەر نییەت و مەبەستێک بێت هاوبەشدانانە بۆ خوای تاکوپاک... جا بۆ فریشتەیەک بکرێت یان بۆ پێغەمبەرێک یان بۆ پیاوچاکێک یان بۆ هەر کەس و شتێکی تر..

٣. لە بنەماکانی خواپەرستی ئەوەیە کە دەبێ بە خۆشەوویستی و ترس و ئومێدەوە خوای گەورە بپەرسترێت. لێکجوداکردنەوەی ئەم سێیەو خواپەرستن بە یەکێکیان یان بە دوانیان بێ ئەوی تر

گومڕاییە. وەکو زانایەک دەفەرموێ: (هەر کەسێک تەنها لەبەر خۆشەویستی، خوای گەورە بپەرستێت، ئەوە زەندیقە. هەر کەسێک هەر لە ترساندا بیپەرستێت، ئەوە حەرەروریی (خەواریج)ە. هەر کەسێک هەر بە ئومێدەوە بیپەرستێت، ئەوە مورجیئەیە).

٤. ملکەچکردن و گوێڕایەڵی تەواو بۆ خوای گەورەو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و باوەڕبوون بە خوای گەورە کە پەروەردگارو پەرستراوو داوەرەو هیچ مەخلوقێک لە هیچ بڕیارێکییدا تەداخول ناکات و هاوبەشی حوکمکردنی نابێت. هیچ کەسێکیش بە هیچ کلۆجێک بۆی نییە یاساورێسای پێچەوانە بە شەریعەتی ئەو داڕێژێت، یان داوەریی بباتە لای غەیری شەریعەتەکەی ئەو، یان شوێن دەستوورێکی پێچەوانەی شەریعەتەکەی ئەو بکەوێت. هەر کەسێک ڕێسایەکی دینەکەی ئەو بگۆڕێت کافر دەبێت. هەر کەسێک لافی ئەوە لێبدات کە بۆی هەیە بە شەریعەتی ئەوەو پابەند نەبێت، کافر دەبێت.

٥. حوکمکردن بە غەیری ئەوەی کە خوای گەورە ناردوێتییە خوارەوە کوفری گەورەیەو دەشێت لە حاڵەتێکدا ببێتە کوفری گچکە.

- یەکەمیان بەوەیە کە یاساو ڕێسایەک دەردەکات یان بە یاساو ڕێسایەکی پێچەوانەوە پابەنددەبێت و دەیچەسپێنێت. یان پێی وا دەبێت کە ئەوە جائیزە.
- دووەمیان ئەوەیە کە لە حاڵەتێکی زاڵبوونی حەزو هەواوهەوەسی خۆیدا بڕیارێک بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەیەک یان هەڵوێستێک دەردەکات کە بە پێچەوانەی شەریعەتی خوا دێتەوە. بەو مەرجەی بزانێت کە حوکمەکەی شەرع ڕەاستو دروست و ڕەوایەو ئەم خۆی گوناحبارکردووە تێیدا.

٦. دابەشکردنی دین بۆ (حەقیقەت)ێک کە کەسانێکی تایبەت دەیزانن و (شەریعەت)ێک کە عەوامی خەڵکی بە گشتی پێوەی پابەند دەبن، هەروەها جوداکردنەوەی سیاسەت یان چالاکی تر لە دین، ڕەفتارێکی باتڵە. هەرچی ڕەفتارێک _حەقیقەت بێت یان یاساو ڕێسا یان شتی تر_ کە پێچەوانەی دینەکەبێت، کوفرە یان گومڕاییە. بە پێی خودی ڕەفتارەکەو ڕادەی لادانی لە دینەکە حوکمە شەرعییەکەی بەسەردا دەدرێت.

٧. هەر خوای گەورە نادیار (غەیب) دەزانێت. غەیری ئەو غەیب نازانێت. هەر کەسێک لافی ئەوە لێبدات کە خۆی یان یەکێکی تری غەیری خوای گەورە غەیب دەزانێت، پێی کافر دەبێت. ئەوەش

بزانرێت کە باوەڕبوون بەوەی کە خوای گەورە ئەگەر وویستی هەندێک کەس لە نادیارێک ئاگاداردەکاتەوە، حەقە.

٨. بەراستزانینی فاڵگرەوەو جادووگەران کوفرەو چوونە لایان گوناحی گەورەیە.

٩. ئەو خاترانە(تەوەسسول)ەی لە قورئاندا هاتووەو جائیزە، ئەوەیە کە جۆرەها خواپەرستی ئەنجامدەدرێت بۆ لەخوانزیکبوونەوە. ئەمەش سێ پۆلە:

أ_ خاترانەی شیاو: ئەوەیە کە دەوترێت خوایە لەبەرخاتری ناوو سیفەتەکانی خۆت، یان دەوترێت خوایە لەبەر ئەو کارەچاکەی لەبەرخاتری تۆ کردوومە، یان بە کەسێکی پیاوچاکێکی زیندوو بوترێت دوعامان بۆبکە.

ب _ خاترانەی بیدعەیی: ئەوەیە کە داوایەکی خاترانەی وا بکات کە لە شەرعدا نەهاتبێت. وەکو داواکردن لەبەرخاتری زاتی پێغەمبەران و پیاوچاکان، یان لەبەرخاتری پلەو مەنزیلەو ماف و ڕێزییان یان شتی تریان داوا لەخوای گەورە بکات .

ج _خاترانەی شیرکییانە: کە مردوویەک بکات بە واسیتەی نێوان خۆی و خوای گەورە. یان لێی بپاڕێتەوە، یان ڕاستەوخۆ داوای دەبرکردنی پێداوویستییەکانی لە مردووەکە بکات. یان ڕەفتاری تری هاوشێوە.

١٠. پیرۆزیی وبەرەكەت لە خوای گەورەوەیە. بەرەكەت و تەبەڕوك: بریتییە لە خێرو زیادەی خێر، كە لە شتێكدا دەبێت:

_ لە كاتدا: وەكو شەوی قەدر.

_ لە شوێندا: وەكو سێ مزگەوتە پیرۆزەكە.

_ لە كەرەستەدا: وەكو ئاوی زمزم.

_ لە كردەوەدا: وەكو: هەموو كردەوە چاكەكان.

_ لە كەسەكاندا: وەكو: خودی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت.

تەبەڕوك بە كەسی ترەوە ناكرێت، نە بەخۆیان و نە بە ئاسەوارەكانیان. جگە لە زاتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و ئاسەوارەكانی كە بەڵگەی شەرعییان لەسەر هاتووە. ئەمەش بە كۆچی دوایی كردنی علیه الصلاة والسلام كۆتایی پێهاتووە.

دەشێت خوای گەورە بەرەكەتی خۆی بخاتە هەندێک لە مەخلووقەكانیەوە. بەڵام دەبێ ئەوە بزانرێت كە هیچ شتێک لەم بارەوە بە بێ هەبوونی بەڵگەی شەرعی ناسەلمێنرێت.

١١. تەبەڕووک لە ڕەفتارە تەوقیفییەكانە، نابێت هیچ شتێک بە موبارەک بزانرێت و بۆ تەبەڕوک ڕەفتاری لەگەڵدا بكرێت بە بێ هەبوونی بەڵگەی شەرعی.

١٢. ڕەفتاری خەڵک لە چوونەسەر گۆڕدا سێ جۆرە:

یەكەم: زیارەتی شیاو: بریتییە لە چوونەسەرگۆڕ یان گۆڕستان، بۆ سەلامكردن لە مردووەكەو دوعابۆكردنی، یان بۆ بیركەوتنەوەی مردن و قیامەت.

دووەم: زیارەتی بیدعەیی: كە ڕێ لە تەواوبوونی تەوحید دەگرێت. كە لەوانەیە سەریش بكێشێت بۆ شیرك. وەكو ئەوەی مەبەستی لە زیارەتەكە ئەنجامدانی پەرستنێك بێت بۆ خوای گەورەو بە ئومێدی نزیكبوونەوە لێی، بەڵام بە واسیتەی مردووەكەوە. یان مەبەستی بەدەستهێنانی بەرەكەت بێت لە مەرقەدەكەوە یان لە مردووەكەوە. یان بیەوێت بە واسیتەی گۆڕنشینەكەوە خێرەكەی قبووڵ ببێت.. یان بچێتە سەر گۆرەكە بۆ هەڵبەستن و مۆم داگیرساندن و گومەز لەسەردانانی. یان بۆ بیناكردنی مزگەوتێك لەسەر گۆڕەكە. یان چوونە زیارەتی خودی مەرقەدەكە –بەتایبەت- بە ئومێدی پاداشتی خوایی.. یان ڕەفتاری تری هاوشێوە، كە لە شەرعدا بەرهەڵستییان لێكراوەو ڕێیان لێگیراوە. چونكە هیچ ئەسڵێكیان لە بەڵگەی شەرعییدا نییە.

سێیەم: زیارەتی شیركیی: كە پێچەوانەی خوابەیەكناسینە، چونكە ئەنجامدانی پەرستنێكە بۆ نیشتەجێی گۆرەكە، كە دەبوو تەنها تەنها بۆ خوای گەورە بكرایاو بەس. وەكو پاڕانەوەی لە خاوەن گۆڕەكە لە جیاتی پاڕانەوەی لە خوای گەورە. یان هاناو

هاواربۆبردنی کە دەبوو بۆ خوای گەورەی بکات. یان تەوافکردن (خولانەوە)ی بە دەوری گۆڕەکەدا. یان قوربانیکردنی بۆی. یان نەزرلەخۆگرتن بۆی. یان پەرستنی تر..

١٣. هۆکارو وەسیلەکان هەر حوکمی مەبەستەکانیان هەیە. بۆیە دەبێ رێ لە هەموو هۆکارو وەسیلەو شێوازە رەفتارێک بگیرێت کە سەربکێشێت بۆ شیرک، یان بۆ بیدعەسازیی.. چونکە هەموو داهێنراوێک بیدعەیەو هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە.

**پێنجەم:**

## بـاوەڕ

١. باوەڕ گوفتارو کردارە، زیادو کەمدەکات. باوەڕ: گوفتاری دڵ و زمان و کرداری دڵ و زمان و جەستەیە.

- گوفتاری دڵ: باوەڕپێبوون و بەڕاستگۆزانینە. گوفتاری زمان: بڕیاردانە.
- کرداری دڵ: خۆتەسلیمکردن و خواوویستیی و ملکەچیی وخۆشوویستن و ویستنی کاروکردەوەی چاکەیە.
- کرداری ئەندامانی لەش: ئەنجامدانی فەرمانپێکراوان و دوورکەوتنەوەیە لە بەرهەڵستیلێکاراون.

٢. هەر کەسێک پێی وا بێت کردار لە پێکهاتەی باوەڕنییە، ئەوە مورجیئەیە. هەرکەسێک ئیزافاتی تری بۆ باوەڕکرد، ئەوە بیدعەچییە.

٣. هەر کەسێک بڕیاری شایەتمانی نەدابێت و راینەگەیاندبێت، ناووحوکمی موسوڵمان –نەلەدنیاداو نە لە رۆژی دواییدا- نایگرێتەوە.

٤. ئیسلام و ئیمان دوو زاراوەی شەرعین، پەیوەندی گشتێتی و تایبەتێتییان لە نێواندایە، کە پێکەوە لە یەک شوێندا دێن مانایان یەک دەبێت، کە بە جیاواز هاتن هەر یەکەیان مانای تایبەتی خۆی

دەبێت. ئەو کاتە باوەڕ: باوەڕهێنانە بە پێنج روکنەکانی باوەڕ. ئیسلامیش باوەڕهێنانە بە پێنج روکنەکانی ئیسلام. بە هەموو ئەوانەی ئەهلی قیبلەن پێیان دەوترێت: موسوڵمان.

٥. بکەری گوناحی گەورە لە بازنەی باوەڕ ناچێتە دەرەوە. لە دنیادا موسوڵمانە، بەڵام باوەڕەکەی نوقسانە، لە قیامەتیشدا دەکەوێتە ژێر بەزەیی خوای میهرەبان، کە دەشێت لێیخۆشببێت و دەشێت سزای بدات. موەحیدەکان (هەموو ئەوانەی خوایان بە یەک ناسیووەو تەنها ئەویان پەرستووە) بەهەشتین، ئەگەرچی تێشیاندایە کە لە دۆزەخدا سزا دەدرێت، بەڵام کەسیان بە نەمریی لە دۆزەخدا نامێننەوە.

٦. ناشێت بە کەسێکی دیاریکراو بووترێت بەهەشتییە یان دۆزەخییە، مەگەر بە دەقێکی شەرعی ئەوەی بەرامبەر سەلمێنرابێت.

٧. کوفر لە لە زاراوە شەرعییەکاندا دوو بەشە: کوفری گەورە، کە خاوەنەکەی لە دین و ئوممەت دەکاتە دەرەوە. کوفری گچکە، کە خاوەنەکەی لە دین و ئوممەت ناکاتە دەرەوە، ئەمە هەر ئەوەیە کە پێشی دەڵێن: کوفری کردەوەیی.

٨. تەکفیر (بەکافردانان) حوکمێکە دەبێت بە بەڵگەی قورئان و سوننەت بسەلمێنرێت، بۆیە نابێت موسوڵمان بە ئەنجامدانی گوفتارێک یان کردارێک ـبێ هەبوونی بەڵگەی شەرعیـ بە کافر

دابنرێت. مەرج نییە کە حوکمێکی گشتی بەکافردانان گوفتارێک یان کردارێک بگرێتەوە، شمووڵی کەسێکی دیاریکراو بکات، مەگەر مەرجەکانی حوکمی بەکافردانانی تێدا هاتبنەدیی و بەربەستی شەرعیی لە دەرکردنی حوکمەکەدا نەبێت. بەکافردانان لە خەتەرترین حوکمدانە، بۆیە پێویستە سڵی لێبکرێتەوەو حەزەر لە بەکافردانانی موسوڵماندا بکرێت.

٩. لە دەرکردنی حوکمی گشتیی تەکفیردا (کە موفتی و قازیی تێیدا بەشدارن) دەبێ چوار روکنی حوکمەکە بچەسپێت:

أ. ئەو مەرجانەی دەبێ لە بکەری رەفتارەکەدا هەبن، وەکو باڵغێتیی و ئاقڵێتیی و زانینی ئەوەی کە رەفتارەکە کوفرینەو ئەمیش بە ئەنقەست و بە ویستی سەربەستەوە نواندوێتی.

ب _ ئەو مەرجانەی دەبێ لە رەفتارەکەدا هەبن، کە هۆکاری دەرچوونی حوکمە شەرعییەکەیە. وەکو ئەوەی کە دەبێ بەڵگەی شەرعی رۆشن و راشکاوی بێ گومان لەسەر ئەوە هەبێت کە رەفتارەکە کوفرینەو بەڵگە شەرعییەکە راشکاوانەو بێگومان دەیگرێتەوە.

ج _ ئەو مەرجانەی دەبێ لە چۆنیەتیی سەلماندنی رەفتارەکەدا هەبن. کە دەبێ کوفرێتی رەفتارەکە (گوفتاربووبێت یان کردار) بە شێوازی شەرعییانە بسەلمێنرێت.

د _ نابێت هیچ ڕێگرێکی شەرعیی _وەکو نەزانین و ناچارکردن و تەقلیدو تەئویل _ لە کێشەکەدا هەبێت.

١٠. دەرکردنی حوکمی تەکفیری دیاریکراو دەبێت لە لایەن کەسێکی شیاوکراو (موئەهھەل)ەو بێت، کە قازییەکی تەعیینکراوی دەسەڵاتێکی شەرعیی دەبێت، یان موفتییەکی ناو خەڵکەو بە زانستی شەرعیی و تەقواکاریی ناسراوە. دەتوانێت بەڵگەی شەرعیی لە سەرچاوەکانییەوە بهێنێتەوەو دینداریێتیی ورەفتارو ڕەوشتیشی جێمتمانە (ثقة)ن.

**شەشەم:**

## قورئان و ئاخاوتن

١. قورئان ٠بەپیت و مانایەوە- فەرمایشتی خوای گەورەیە. خەلقنەکراوە. لە خوای گەورەوە دابەزیووە، بۆ لای ئەویش دەگەڕێتەوە. قورئان موعجیزەیە، بەڵگەیە لەسەر راستگۆیی ئەو کەسەی بۆی هاتۆتە خوارەوە علیه الصلاة والسلام. تا رۆژی دواییش هەروا بە پارێزراوی دەمێنێتەوە.

٢. خوای گەورە دەربارەی هەر شتێک و هەر کاتێک و بە هەر چۆنییەتییەک بیەوێت دەدوێت. قسەکردنی راستییە، بەدەنگ وپیتە، ئێمە چۆنییەتییەکەی نازانین و ناشکەوینە قسەوباسلێکردنییەوە.

٣. ئەوەی کە دەوترێت کە قسەکردنەکەی خوای گەورە واتای دەروونییە، یان قورئان گێڕانەوەیە، یان دەستەواژەیە، یان مەجازە یان بۆهاتنە یان وەسفی تری هاوشێوە، ئەمانە هەمووی گومڕایی و لاڕێبوونەو دەشێت بگاتە پلەی کوفر.

٤. هەر کەسێک نکووڵی لە شتێکی قورئان بکات، یان لاف وگەزافی ئەوە لێبدات کە گوایە نوقسانە یان زیادەی تێدایە یان لێلادات، کافردەبێت.

٥. قورئان دەبێت بە پێی ئەو ڕێسایانەی لە مەنهەجی سەلەفدا هەن لێکبدرێتەوە، بە راوبۆچوونی خۆ لێکنادرێتەوە، چونکە دەشێت قسە بە ناوی خواوە بکات بێ ئەوەی زانیاری هەبێت. ئەوجۆرە لێکدانەوەی باطنییەکان هەیانە، کوفرە.

٦. ڕێسای سەلەف لە لێکدانەوەی دەقی قورئان و فەرموودەدا ئەوەیە کە بە پێی زمانی عەرەبی دەبێت و سەلماندنی فەرموودەش بە پێی ڕێساکانی فەرموودەوانان دەبێت کە بۆ توێژینەوەی ریوایات کردوویانە.

**حەوتەم:**

## قەزاو قەدەر

١. باوەڕبوون بەوەی خێرو شەڕی قەزاوقەدەر لەلای خوای گەورەوە دێن، یەکێکە لە روکنەکانی باوەڕهێنان. کە بریتییە لە باوەڕبوون بە هەموو ئەو دەقانەی باس لە قەدەرو ئاستەکانی دەکەن: (زانین، نوسین، ویست، خەلقکردن). هەروەها باوەڕبوون بەوەی کە بڕیاری خوای گەورە رەتکردنەوەی نییەو کەسیش بۆی نییە دەسکاری بڕیارەکانی بە هیچ شێوەیەک بکات.

٢. ویست و فەرمانی خوای گەورە _کە لە قورئان و سوننەتدا هاتوون_ دوو جۆرن:

أ. ویستی گەردوونیی قەدەرییانە (کە بە مانای حەزکردنە)، هەروەها فەرمانی گەردوونی قەدەرییانە.

ب . ویستی شەرعییانە (کە بە خۆشەویستی خوای گەورەوە پەیوەستە)، هەروەها فەرمانی شەرعییانە.

مەخلووقەکانیش ویست و حەزیان هەیە، بەڵام سەربە ویست و حەزی خوای کردگاریانە.

٣. رێنماییکردن و گومڕاییکردنی خەڵکی بە دەست خوای گەورەیە. هەیانە خوای گەورە هەر لە فەزڵ و گەورەیی خۆیەوە هیدایەتی

داوەو هەشیانە _بەدادی خواوویستی_گومڕاییەکەی لەسەر فەرزبووە.

٤. مرۆڤ و کردەوەکانیان مەخلووقاتی خوان، چونکە خوایەکی تری کردگار نییە. خوای گەورە کردگاری کردەوەی مەخلووقەکانە، بەڵام مەخلووقەکان لە راستییدا خۆیان بکەری کردەوەکانیانن.

٥. کردارەکانی خوای گەورە هەموویان بە دانایی دەکرێن، هۆکارەکانیش هەر بە ویست و ئیرادەی خوای گەورە کاریگەرییان دەبێت.

٦. ئاکامی مردن (ئەجەل) نوسراوە. رۆزی دیاریکراوە. کامەرانی و کوێرەوەریی پێش خەلقبوونی کەسەکان لەسەریان نوسراوە.

٧. بەڵگەهێنانەوە بە قەزاوقەدەری خوایی لە بەڵاو موسیبەت و ئازاردا شیاوە، بەڵام لە گوناحکارییدا نەشیاوە، هەر کەسێک گوناحی کردو ووتی قەزاوقەدەرە، لۆمەکراوەو دەبێت تۆبە لە قسەکەشی بکات.

٨. ئیعتیمادکردنە سەر هۆکار (بەتەنها) هاوبەشدانانە بۆ خوای گەورە. وازهێنانی تەواویش لە هۆکارتانەدانە لە شەرع. نکووڵیکردن لە کاریگەریی هۆکار پێچەوانەی شەرع و ئەقڵە. پشتبەستن بەخوای گەورە رێ لە گرتنەبەریی هۆکار ناگرێت.

**هەشتەم:**

## ئوممەت (گەل)

١. مەبەست لە كۆمەڵ (الجماعة) لێرەدا: یاوەرانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و شوێنكەوتووانی ئەوانن لەسەر خێرو چاكەكاریی، كە تا رۆژی دوایی لەسەر دیدو رێی ئەوان دەڕۆن. كۆمەڵەی سەرفراز (الفرقة الناجية) هەر ئەمانن.

هەر كەسێک پابەندی دیدوڕیی ئەمان بێت _ئەگەرچی لە هەندێک بەشی گچكەشدا بەهەڵەدا چووبێت_ هەر لەم كۆمەڵە هەژمار دەكرێت.

٢. تەفرەقەنانەوە لە دیندا جائیز نییە. نابێت ناكۆكیی و فیتنە لە ناو موسوڵماناندا دروستبكرێت. گەڕانەوە سەر قورئان و سوننەت و دیدوڕێی سەلەف _بۆ یەكلایی كردنەوەی ناكۆكییەكانی نێوان موسوڵمانان_ فەرزە.

٣. هەر كەسێک لە كۆمەڵ لابدات، پێویستە ئامۆژگاریی بكرێت، دەبێ بانگهێشتبكرێتەوە بۆ ناو كۆمەڵەكەو بە شێوەی جوان و نەرمونیان موناقەشەی لەگەڵدا بكرێت و هەنجەتی ببڕرێت. ئەگەر پەشیمانبۆوەو گەڕایەوە دەبێ قبووڵبكرێتەوە، ئەگەر نا بەو سزا شەرعییەی شایانێتی سزا دەدرێت.

٤. پێویستە خەڵکی بە مەبدەئە سەرەکییەکانی ئیسلامەوە پابەندبکرێن، ئەوانەی لە قورئان و سوننەت و کۆڕا (ئیجماع)دا هاتوون. ناشێت عەوامی موسوڵمانان بە مەسەلە ووردەکارییەکانی دین و واتا قووڵەکان تاقیبکرێنەوە.

٥. ئەسڵ لە وەسفی موسوڵماندا ئەوەیە کە نییەتی دروست و عەقیدەی پاکە، تا پێچەوانەی ئەمانەی لێوە دەردەکەوێت. بۆیە حوکمی گشتی رەفتاری موسوڵمان وا دەدرێت کە چاکە. ئەگەر نییەت پیسی و کەللەڕەقی لێوە دەرکەوت، ناشێت هەر بە باشە بۆی لێکبدرێتەوە.

٦. ئەو کۆمەڵ و تاقم و دەستانەی ئەهلی قیبلەن، بەڵام لە دەرەوەی بازنەی سوننەتدان، هەڕەشەی بەفەتارەتچوون و سزای دۆزەخیان لەسەر دەبێت. حوکمیشیان حوکمی گشتی ئەوانەیە کە کەوتوونەتە بەر هەڕەشەی خوایی، مەگەر کەسانێکیان کە لە ناخی خۆیاندا کافربن..

٧. نوێژی هەینی و نوێژی بەکۆمەڵی مزگەوت لە گەورەترین دروشمە دیارەکانی ئیسلامن. نوێژ لە دوای کەسی حاڵنەزانراوەوە جائیزە، وەلکردنی _بە بەهانەی ئەوەی نازانین حاڵنەزانراوەکە چۆنە_ بیدعەیە.

٨. نوێژی جەماعەت لە دوای بیدعەچییەوە کە بیدعەکەی ئاشکراکردبێت، هەروەها لە دوای فاسقێکەوە کە گوناحی گەورەی لێوەدەرکەوتبێت، جائیز نییە، بەو مەرجەی کەسانی شیاو لەو کات و شوێنەدا نەبووبن نوێژەکەیان لەدواوە بکرێت. لەم حاڵەتەدا جائیزە. بەڵام لە کاتی هەبوونی کەسی شیاودا نوێژکردن لەدوای بیدعەچیی و فاسقەکەوە هۆکاری گوناحبوونە، مەگەر خراپەیەکی گەورەتری پێلابدرێت. ناشکرێت نوێژی هەینی و نوێژی بەکۆمەڵی مزگەوت وەلکرێن.

هەر کەسێک حوکمی کافربوونی درا، نوێژکردن لە دوایەوە جائیز نامێنێت.

**نۆیەم: دەسەڵاتی سیاسی:**

## ئەحکامی ئیمامەت
## (دەسەڵات)

١. حاکمێتیی (دەسەڵاتی یاسادارِشتن و فەرمانڕەوایی سیاسیی و دەستووریی و داوەریی) مافی خوای گەورەیە، بە سنووری دیاریکراوەوە بەخشیوێتی بە هەندێک مرۆڤ:

أ_ پۆلی یەکەم: هەموو نێرراوە پێغەمبەرەکان سەلامی خوایان لێ بێت مافی حاکمێتییان لە کۆمەڵگەکانی خۆیاندا هەبووە. ئەم بەڕێزانە (رسول و نبي و إمام) بوون. بۆ نموونە: پێنج ئولولعەزمەکە: نووح و ئیبراهیم و مووساو عیساو موحەممەد سەلامی خوایان لێ بێت.

ب _ پۆلی دووەم: لەسەر پەیامی نێرراوە خاوەن پەیامەکەی پێش خۆیان رۆیشتوون و حوکمیان بەو کردووە. ئەم بەڕیزانە (نبي و إمام) بوون. بۆ نموونە ئەو پێغەمبەرە بەڕیزانەی لە نێوان سەیدنا مووساو سەیدنا عیسادا عليهم السلام بۆ بەنوئیسرائیل هاتوون. وەکو سەیدنا داوودو سولەیمان عليهما السلام.

ج _ پۆلی سێیەم: ئەوانەی کە نێرراو یان پێغەمبەر نەبوون و یاوەری ئەوان بوون، یان لەسەر دیدو رێی ئەوان بوون، هەر (إمام) بوون، وەکو چوار خولەفای راشیدین خوا لێیان رازی بێت.

٢. لوتکەی هەرەمی دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامیی خەلیفەیە، کە پێشی وتراوە ئەمیرولموئمنین، سیستمی حوکمڕانیەکە خیلافەتە، کە شەرعناسان و زانایان پێیان وتووە: ئیمامەتیی مەزن (الإمامة الکبری)[١]. مەرجە لەسەر دیدو ڕێی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و خەلیفە راشیدینەکانی بێت.

٣. ئیمامەتی مەزن: دەسەڵاتی تەواویی حوکمکردنە[٢]، بە کۆڕا (ئیجماع)ی ئوممەت دەبێت، بەهەڵبژاردنی ئوممەت بۆی و بەبەیعەتپێدانی ئەهلی حەلل و عەقد دەچەسپێت. خەلیفە جێگری ئوممەتەکەیە لە راپەڕاندنی ئەحکامەکانی شەرعدا، کە دەبێ ـبەپێی ڕێسا نەگۆڕەکانی دینـ بێت، تا دادپەروەریی بچەسپێنێت، کە ئەمەی کرد، لەسەر ئوممەتەکە فەرز دەبێت گوێڕایەڵیی و ملکەچیی دەربڕن بۆی.

---

[١] فەرزێتی خیلافەت بە بەڵگەی بنبڕی دەقی قورئان و سوننەت و کۆڕا (ئیجماع)ی یاوەران و بە بەڵگەی هزرو ژیریی و بەرژەوەندی واقیعیی سەلمێنراوە

[٢] ئیمامی حەرەمەین جوەینی لە کتێبی (غیاث الأمم في إلتیاث الظلم.ل: ١٥)دا دەفەرموێ: (الخلافة: رئاسة تامة، وزعامة عامة، تتعلق بالخاصة والعامة، في مهمات الدین والدنیا).. واتە: خیلافەت: سەرۆکایەتییەکی تەواوو، پێشەوایەتییەکی گشتییە کە هەموو کاروبارێکی تایبەت و گشتی دەگرێتەوە، لەوەی پەیوەندی بە دین و دنیاوە هەیە..

٤. هەر کەسێک بە زۆر دەسەڵاتی گرتەدەست و شەریعەتی خوای کردە دەستوری وڵات و رایپەڕاندو رای لەسەر گردبۆوە، پێویستە ملکەچی لە خێرخوازیی و چاکەکارییدا بۆ دەربڕڕێت و ئامۆژگاری بکرێت. شۆڕشکردن و یاخیبوون دژی ئەم دەسەڵاتە حەرامە، مادام سەروەرێتی (دەسەڵاتی باڵای وڵات) بۆ شەرع پاراستووە. کاتێک کوفرێکی زەق لە ئیمام (خەلیفە)وە دەردەکەوێت کە بەڵگەی شەرعیی لەسەری هەبێت، لادانی ئەوو دانانی شیاوێک لەسەر ئوممەتەکە فەرزدەبێت.

٥. نوێژو حەج و جیهادکردن لەگەڵ پێشەوایانی ئیسلامدا فەرزە، ئەگەرچی ستەمیش بکەن.

٦. جەنگ بەرپاکردن _لەسەر مەبەستی دنیایی یان هەست و ئینتیمای جاهیلیی_ لە نێوان موسوڵماناندا حەرامە. یەکێکە لە گوناحە هەرەگەورەکان. بەڵام جەنگ بەرپاکردن دژی بیدعەچیی و دەستدرێژکاران و یاخییان و هاوشێوەیان _ئەگەر بە غەیری کوشتار نەدەتوانرا خراپەکارییەکانیان دووربخرێتەوە_ جائیزە. دەشێت بە پێی حاڵەت و بەرژەوەندیی ئوممەتەکە فەرزیش ببێت.

٧. یاوەرانی بەڕێز هەموویان جێمتمانەن، باشترین کەسانی ئەم ئوممەتەن. شاهیدیدان لەسەر موسوڵمانێتی و پیاوچاکیان ئەسڵێکی بنبڕەو لە بەڵگەنەویستەکانی دینە. خۆشویستنیان لە دینداریی و

ئیمانداریيەوە دێت، بوغزاندنیان لە کوفرو دووڕوویيەوە دێت. ڕێزیان دەگیرێت بۆ ئەوەی تانەوتەشەریان لێبدرێت، یان تەدەخول بکرێتە ناکۆکییەکانی نێوانیان، بە شێوەیەک کە لە قەدریان کەمبکاتەوە.

چاکترینی یاوەران ئەبوبەکری صددیقە خوا لێی رازی بێت ، پاشان عومەری کوڕی خەطتابە خوا لێی رازی بێت، پاشان عوثمانی کوڕی عەففان خوا لێی رازی بێت، پاشان عەلی کوڕی ئەبطالیب خوا لێی رازی بێت. ئەمانە خولەفای راشیدینن. حوکمڕانی خیلافەتەکانیان هەر بەو ریزبەندییە کە ناویانی تێدا هاتووە.

٨. خۆشویستنی ئالوبەیتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و ڕێزگرتنی ژنەکانیی _کە دایکانی موسوڵمانانن_ و ڕەچاوکردنی فەزڵ و گەورەییان، هەروەها زانینی فەزڵی پێشەوایانی سەلەف و زانایانی سوننەت و شوێنکەوتووانیان لەسەر خێرو چاکەو. دوورکەوتنەوە لە بیدعەچیی و هەواسبازان، ئیماندارێتی و دیندارێتییە.

٩. جیهادکردن لە پێناوی خوای گەورەدا لوتکەی بڵندی ئیسلامەکەیەو تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت.

١٠. فەرمانکردن بەچاکەو بەرهەڵستیکردن لەخراپە لە گەورەترین دروشمی ئیسلامن و مایەی پاراستنی کۆمەڵی موسوڵمامانانن. کە بە

پێی هەبوونی هێزو تواناو بەرژەوەندیی رەسەن و موعتەبەر، مومارەسە دەکرێت.

**دەیەم:**

## دارولئیسلام و دارولکوفر
## (دەوڵەتی ئیسلامی و دەوڵەتانی کوفر)

١. هۆکاری حوکمدان بەسەر ووڵاتێکدا کە دارولکوفرە یان دارولئیسلام جۆری دەستوورو یاسای ووڵاتەکەیە، کە لە لایەن دەسەڵاتداری خاوەن هێزەوە فەرمانی دارشتن و پیادەکردنی بۆ دەرچووە..

٢. ئەگەر موسوڵمانانی وڵاتێک ئەمانیان بە دەست خۆیانەوە نەبوو، با دروشمی پەرستنەکانیش ـوەکو نوێژی جەماعەت و هەینی و جەژنەکانیش بە ئاشکرابکەنـ وڵاتەکە هەر بە دارولکوفر هەژمارد دەکرێت. وەکو وڵاتی میسر لەسەردەمی فاطمییەکاندا، کە زانایانی شەرع لەسەر ئەوە یەکدەنگبوون کە میسر ـلەژێر دەسەڵاتی فاطمییەکانداـ بووە بە دارولکوفر.

٣. دینی زۆرینەی دانیشتوان، کاریگەریی لە حوکمدان لەسەر ووڵاتان نیە.

٤. ئاشکرایی خواپەرستیی، کاریگەریی لە حوکمدان لەسەر ووڵاتان نیە.

٥. ئەمانی هەندێک لە دانیشتوانی ووڵات، کاریگەریی لە حوکمی ووڵاتان نیە.

٦. کۆمەڵێک ئەحکامی شەرعی هەن کە پەیوەستن بە حوکمدان بەسەر وڵاتێکدا کە ئایا دارالکوفرە یان دارولئیسلامە ؟! گرنگترینیان ئەحکامی هیجرەت و جیهادە.. لەو ئەحکامەنە:

أ_ ئەگەر دارولئیسلام لە دنیادا نەمابوو، هیجرەتکردن لە دارالکوفرەوە بۆ دارولئەمان (کە هەر دارولکوفرەو دژایەتی موسوڵمانی کەمتر لێدەکرێت) لەسەر ئەو کەسانەی توانایان هەیە هیجرەتکەن، فەرزدەبێت.

ب _ هەر کەسێک بە ئەمانێک چووە ووڵاتی کافرانەوە بە هیچ شێوەیەک بۆی نیە خیانەت لە خوێن و سامانی (خۆیان و ئەو کەسانەی لە ئەمانی ئەواندانداندان)دا بکات، چونکە پەیماندان بەرپرسێتی لای خوای لەسەرە..

ج _ ئەو ڤیزەیەی موسوڵمان دەستیدەکەوێت بۆ ئەوەی بچێتە ووڵاتی کافرانی ئەسڵیەوە، بە گرێبەستی ئەمان دادەنرێت. هەروەها قبووڵکردنی داوای پەنابەریی و ئیقامەو جنسیەی ئەو وڵاتە.

## گرنگترین تایبەتمەندییەکانی
## ئەهلی سوننەت و جەماعەت

ئەهلی سوننەت و جەماعەت کۆمەڵە سەرفرازەکە (الفرقة الناجية)ن و پێشرەوە سەلەفییە جیهادییەکانیشیان دەستە سەرخراوەکە (الطائفة المنصورة)ن، کە بە کۆمەڵێک سیفەتی تایبەتی لە غەیری ئەوان جودا دەکرێنەوە. لەوانە:

١. بایەخدانیان بە قورئان (بە لەبەرکردن و خوێندنەوەو لێکدانەوەی)و بە فەرموودە (زانین و تێگەیشتن و جوێکردنەوەی سەحیحی لە زەعیف) چونکە فەرموودە سەرچاوەی دووەمی وەرگرتنی دینەکەیە. دەشفەرموون کە دەبێ زانینەکە بە کردەوە نیشانبدرێتەوە.

٢. وەرگرتنی دینەکە هەمووی، باوەڕبوون بە قورئان هەمووی، ئەهلی سوننەت و جەماعەت باوەڕیان بە دەقەکانی بەڵێنی خوایی هەیە، هەروەکو کە باوەڕیان بە دەقەکانی هەڕەشەی خوایی هەیە. باوەڕیان بەو دەقانە هەیە کە سیفەتەکانی خوای گەورە دەسەلمێنن، بەوانەش کە سیفاتی کەموکورتیی لێدوور دەخەنەوە. لەوکاتەی باوەڕیان بە قەزاوقەدەری خوا هەیە، باوەڕیشیان بە حەزو وویست و توانای عەبد هەیە لە ئەنجامدانی ڕەفتارییدا. لەوکاتەدا کە زانست و خواپەرستیی پێکەوە وەردەگرن و دەیسازێنن،

هێزو بەزەییش پێکەوە وەردەگرن و دەیسازێنن، هەر ئاواش هۆکارو زاهیدێتی پێکەوە وەردەگرن و دەسازێنن.

٣. شوێنکەوتن و دوورکەوتنەوە لە بیدعەسازیی و گردبوونەوە لەسەر دیدوڕێ و وەلکردنی ئەوانەی مایەی تەفرەقەسازیی و ناکۆکی و راجوێی دینیین.

٤. رەچاوکردنی دیدو رێی پێشەوایانی جێمتمانەو ئیقتیداپێکردنیان لە وەرگرتنی هیدایەتی خوایی و دین و دینداریدا. لە وەرگرتنی زانست و کارپێکردنییدا. لە بانگەوازو گرتنەبەریی هەڵوێستی یاوەران و هەڵوێستی ئەو کەسانەی لەسەر رێبازی ئەوان دەڕۆن وخۆدوورەپەرێزگرتن لە خۆلادان لە رێبازیان. لە بزاوت و هەڵوێستیان.

٥. میانڕەوێتی (التوسط) کە بریتییە لە تێگەیشتنی دروستی عەقیدەکە، ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە گوفتارو رەفتارو بڕیاریاندا وان لە نێوان دەستەو تاقمی شلگیریی و دەستەو تاقمی توندڕەوییدا.

٦. سوورن لەسەر یەکخستنی هەڵوێستی موسوڵمانان لەسەر حەق و رێکخستنی ریزەکانیان لەسەر تەوحیدو سوننەت. سوورن لەسەر دوورکەوتنەوە لە هەموو هۆکارێکی ناکۆکیی و تەفرەقەی نێوان خۆیان.

٧. ئەرکەکانی گەیاندنی بانگەوازی خوایی و فەرمانبەچاکەو بەرهەڵستی لەخراپەو جیهادکردن و زیندووکردنەوەی سوننەت و کارکردن بۆ نوێکردنەوەی دینەکەو وەرگرتنی حوکمی شەرع لە شتی گەورەو گچکەدا بە فەرزی سەرشانی خۆیان دەزانن.

٨. دادپەروەریی و بە ئینصافیی: ئەهلی سوننەت و جەماعەت مافەکانی خوای گەورە دەخەنە پێش مافەکانی خۆیان و کۆمەڵەکەیان. مافی کەس پێشێل ناکەن. لە دۆستایەتییدا بە ناهەق لەسەر کەس ناکەنەوەو لە دوژمنداریێتییدا سنووری مافی کەس نابەزێنن.

٩. شوێنکەوتوانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت _هەرچەند لە کات و شوێندا دووریش بن لەیەک_ لە تێگەیشتنی مەنهەجدا وەکویەکن، لە بزاوت و هەڵوێستدا هاوشێوەی یەکن، چونکە سەرچاوەی لێوەرگرتن و چۆنیەتی لێوەوەرگرتنیان یەکە.

١٠. ئەهلی سوننەت و جەماعەت بە چاکەکاریی و رەوشتی پارسنەگ و رەفتاری بە بەزەییانە لەگەڵ هەموو خەڵکییدا ناسراون.

١١. ئامۆژگارییان بۆ خوای گەورەو بۆ پێغەمبەری خوا صلی اللّٰه علیه وسلم و بۆ پێشەوایانی موسوڵمانان و هەموو موسوڵمانانە بە گشتی.

١٢. بایەخدان بە کاروباری موسوڵمانان و لەسەرکردنەوەو سەرخستنیان و بەدەستهێنانی مافەکانیان و ڕێگرتن لە زیان و ئازار پێگەیشتنیان، سیماو سیفەتی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە.

## پوختەی دیدو ڕێی ئەهلی سوننەت و جەماعەت

١_ باوەڕیان وایە کە مرۆڤ بۆ جێبەجێکردنی ئەرکی ئیستیخلاف نێرراوەتە سەرزەمین.

٢_ شوێنکەوتووانی وەحی دەبێت شارەزای زانستییەکانی شەرع بن و بە سیرەی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت و هەڵوێست و بزاوتی یاوەرانیان پەروەردەبن.

٣. ئەرکی ئیستیخلاف کۆمەڵکاریی ئوممەتی عەقایدیی دەخوازێت، کە روکنەکانی بریتین لە ئیمان و هیجرەت و جیهادو داڵدەدان و سەرخستن.

٤. روونکردنەوەی دینەکەی خوا بۆ موسوڵمان و کافر، هەروەها فەرمان بەچاکەو بەرهەڵستی لە خراپە _کە ئەرکی ناوخۆیی تاکوکۆی موسوڵمانانە_ هەروەها جیهاد _کە ئەرکی تاکوکۆی دەرەکیی موسوڵمانانەو بەرامبەر کافرانی شەڕانی دەکرێت_ بەشێکن لە ئەرکی ئیستیخلاف کە پێش و پاش تەمکین دەکرێن.

٥. ئەستەمە هەموو ئەحکامەکانی ئیسلام _پێکەوە_ بەبێ خیلافەت، کە دەسەڵات و هێزە_ رابپەڕێنرێن، بۆیە فەرزی سەرشانی تاکوکۆی موسوڵمانە کە خیلافەتی ئیسلامی بهێننەوە، کە هێزە رۆژئاواییە

ئیستیعمارییەکان ئیلغایانکردەوە[١]، تا شەریعەتی ئیسلام ببێتەوە بە دەستوورو یاسای ئوممەتەکە، کە ١٢٩١ ساڵ دەستووری حوکمڕانی موسوڵمانان بوو.

٦. له ئیسلامدا هیچ سیستمێکی حوکمڕانی غەیری سیستمی خیلافەت شەرعێتیی نییە. خیلافەتیش دەبێ لەسەر ئەو بنەما جێگیرانە بێت کە ئەم ئوومەتە بە درێژایی مێژوی خۆی کۆک بووە لەسەری.

٧. نەمانی خیلافەت و خەلیفە وەسفی موسوڵمانێتی لە ئەهلی ئیسلام دانابڕێت و خاوەنێتی وڵاتەکەشی _هەرچەندە دابردابڕو بەشکراوە_ ئیلغاناکرێتەوە.

٨. کۆمەڵکاریی ئیسلامیی بۆ هێنانەوی حوکمی ئیسلام لەسەر تاکوکۆی موسوڵمانان فەرزە. ئەم کۆمەڵکارە ئیسلامییانە دوو ئەرکی سەرەکییان دەکەوێتە سەرشان:

- لادان و ڕادانی سیستمی حوکمی کوفرو ئاسەوارەکانی لە ئیدارەی دەوڵەت و ئاڕاستەی ئوممەتدا.

---

[١] لە ١٩٢٤/٣/٣دا بە مستەفا کەمالیان ئیلغاکردەوە کە بوو بە یەکەمین حاکمی عەلەمانی لە تورکیاو لە ووڵاتی موسوڵماناندا.

- جێبەجێکردنی ئەحکامی شەرع لە ناو خۆیاندا بە داوەرییبردنەوە لای قازی شەعبیی ناو خۆیان.

٩. نە دەوڵەت و نە سیستمی حوکم و نە حکومەتی عەلەمانیی و قەومیی و سۆشیالیستیی و لیبراڵیی و نیشتیمانییەکانی وڵاتی موسوڵمانان بە (شەرعیی) یان (ئیسلامیی) ناناسرێن، ئەم کیانانەش هەموویان باتڵن و پێویستە ئیلغابکرێنەوەو لادرێن. چونکە هیچ یەکێک لە پێنج بنەماکەی فیقهی دەستووریی ئیسلامییان تێدا نەماوە، کە بریتین لە:

- ئوممەت و بەیعەتی.
- -خیلافەت و حوکمی ڕەوای.
- شورای ئەهلی حەللوعەقد .
- دەستوورو یاسای شەریعەتی.
- جیهاد.

١٠. مەرج نییە هەموو بڕیارو یاسایەک کە لەم لەتە دەوڵەتە ئیتسیعمارییانەوە دەردەچن ناشەرعیی بن، دەشێت لەگەڵ شەرعدا یەکبگرنەوە لە بواری چەسپاندنی دادپەوەریی بێت یان لە لادانی ستەمێکدا، بۆیە دەشێت موسولمان سوودیان لێوەرگرێت.

١١. حکومەتێکی ئیسلامی کە لە لەتە دەوڵەتێکی وڵاتی موسوڵماناندا دروست دەبێت مانای ئەوە نییە کە سیستمی

خیلافەت دامەزراوە ، چونکە ئەوە ئیمارەتێکی تایبەتی هەرێمێکە.
خیلافەت سەرۆکایەتی هەموو یان زۆرینەی ئوممەتەکەیە.

سوپاس بۆ خوا تەواوبوو